# پەرتوکی

# الناسخ والمنسوخ

## لە قورئانی پیرۆزدا

# alnaasikh w almansukh




کۆکردنەوە و نوسینی : موجاهید
ئامادەکردنی : دامەزراوەی انفال



انفال
ANFAL

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيْم

**پێشەکی :**

**بسم الله الكبير المتعال ، هو الذي امر بعباده للقتال وصلى الله على من بعث بالسيف رحمة للعالمين ، امابعد :**

**فإنَّ أصدقَ الحديثِ كتابُ اللهِ ، وأحسنَ الهدي هديُ محمَّدٍ صلى الله عليه وسلم ، وشرُّ الأمورِ مُحدثاتُها ، وكلُّ محدثةٍ بِدعةٌ ، وكُلُّ بدعةٍ ضلالةٌ ، وكلُّ ضلالةٍ في النَّارِ .**

**سووپاس و ستایش بۆ الله عزوجل کە هیدایەتی داین بە دانانی ئەم پەرتووکە کە گرنگترین و ترسناکترین بابەتە لە زانستەکانی قورئان وەکوو زانایان بەو شێوەیە باسیان کردووە کە هەم گرنگە و هەمیش ترسناکە.**

**ئەم زانستە بریتیە لەوەی کە ئەگەر کەسێک شارەزای ئەم زانستە نەبێت کاتێک دەست دەکات بەخوێندنی قورئان تووشی زۆر پرسیار دەبێتەوە چونکە لە هەندێک شوێن الله تعالی کە باسی بابەتێک دەکات بەڵام دەبینی لە شوێنێکی تر هەمان بابەت بەشێوەیەکی تر باسی دەکات و داخوازیەکەی الله عزوجل بەشتێکی ترە بۆیە کەسی خوێنەر ئەگەر شارەزای بەم زانستە نەبێت لە بەر خۆیەوە جۆرەها گومان و پرسیاری بۆ درووست دەبێت .**

**هەروەکو چۆن جارێکیان لە شاری کوفە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیمامی عەلی کە ڕەت دەبێ بەلای هاوڕێیەکی ابو موسای ئەشعەریدا و دەبینێ ووتار بۆ خەڵکی دەدات یان لە گێڕانەوەیەکی تر دەڵێت کێشە حەل دەکات کاتێ تێدەپەڕێت بەلایدا ئیمامی عەلی پێی دەفەرمێت ناسخ و مەنسووخ دەزانی چی یە ؟ ئەویش دەڵێت نازانم ئیمامی علی پێی دەڵێت: (دەی خۆت بەهیلاکا بردو خەڵکیشت بە هیلاکدا برد).**

**یان لە گێڕانەوەیەکی تر ابن عباس بە هەمان شێوە هەمان قسە بە کەسێکی تر دەڵێت ئەمەش مانای گرنگی ئەم بابەتەیە لای هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەرمان**

(صلی الله علیه وسلم) ، وه ترسناکیەکەشی ئەوەیە کە بەڕاستی ئەم زانستە هیچ مەجالی ڕەئی و تەئویل و اجتهادی تیانی یە واتا کەس بۆی نییە بڵێ فڵان ئایەت وای بۆدەچم نەسخ بۆتەوە یان اجتهاد کات تێیدا یان هەرشتێکی تر چونکە بەڕاستی کتێبێکی زۆر نووسراوە لەسەر ئەم بابەتە هەر لە تابعینە بەڕێزەکانە وە تا سەردەمی خۆمان کە هەرسێ تابعینی بەڕێز [قەتادە و الزهری و عطاء] کتێبیان هەیە لەسەر ئەم زانستە لەلایەن خوێنکارەکانیانەوە نووسراوە وە پاش ئەوانیش قۆناغەکانی دوای تابعین بەردەوام کتێب نووسراوە لەم بابەتەدا وەکو کتێبەکانی [ابن حزم و ابن جوزی و ابو جعفر نحاس ] کە دیارترین نووسەرەکانی ئەم زانستەن .

بەڵام هەندکیان هەندێ ئایەت باس دەکەن و هەندێکیان هەندێ ئایەت باس ناکەن وە ئەمەش ترسناکی بابەتەکەیە بۆیە کەس ناتوانێ بڵێ فڵان ئایەت مەنسووخە هەتا دەقێکی سەریح لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) یان هاوەڵە بەڕێزەکان کە حەدیثێکیان گێڕابێتەوە ووتبێتیان بیستوومانە کە فڵان ئایەت مەنسووخە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) جگە لەم دوو شێوازە کەسی تر بۆی نییە بڵێ فڵان ئایەت مەنسووخە چونکە ئەمە ئایەتی الله تعالی یە پەنا بەالله تعالی لێپرسینەوە ی سەختی لەسەر دەبێت ئەگەر لە الله عزوجل نەترسین و بچین شتی بۆزیاد کەین یان ڕای خۆمانی تیا بڵێین پەنا بەالله عزوجل .

جابۆیە پاش ڕوون کردنەوەی زانستەکە لە چەن وانەیەکدا کاتێک دەچینە سەر ئایەتەکان ئەو ئایەتانەی لە کتێبی تابعینە بەڕێزەکانەوە ئاماژەی پێکراوە نەقڵ دەکەم چونکە ئەوان هەم خوێندکاری سەحابە بوونەو ڕاستەوخۆ لە بەردەستی هاوەڵە بەڕێزەکان خوێندوویانە هەمیش ڕاستگۆترین و باشترینەکانی ئوومەتن لە دوای هاوەڵان ڕەزاو ڕەحمەتی الله عزوجل بباری بەسەریاندا ، هەموومان لە خزمەت پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان لەبەهەشت کۆببینەوە امین .

تێبینی : ئەمە یەکەم کتێبە لەم زانستەدا دەنووسرێ والله اعلم چونکە نزیکەی چەند ساڵێکە بەدوای کتێبێکی کوردی لەم بوارەدا دەگەڕێم دەستم نەکەووت

پێدەچێ هەشبێ و من دەستم نەکەووتبێ بەهەرحاڵ ئەمەی لێرەدا هەیە سەرەتایەکە بۆ ئەم زانستە و هەموو شتێکی نییە بەڵام بەپێی توانا باسی گرنگترین شتەکانی ئەم زانستە دەکەین بۆ فێرخواز بەڵام بەکوورتی ئەگەر فێرخوازی زانستیش وویستی زیاتر بخوێنێتەوە لەسەر ئەم زانستە ئەوە بێ گومان کتێبی زۆر هەن نزیکی حەفتاو یەک کتێبی نووسراو هەیە بەڵام عەرەبین وە دەبێ زۆر ووریا بیت هەندێ کتێبی خەلەف و کۆتاییەکان زۆر ئایەتیان باسکردووە بە مەنسووخ کە هیچ دەلیلێک نی یە لە سەری کە مەنسووخ بێت جا بۆیە دەبێ زۆر ووریا بیت لە خوێندنەوەی سەربەخۆی کتێبەکان.

جا ئەوەی کە وویستم ئاماژەی پێ بدەم لەم تێبینی یە دا  ئەوەیە کەچووینە سەر ئایەتەکان تەنها ئەو ئایەتانە دێنم و باسی دەکەم کە ناسخن یان مەسووخن کە لە کتێبی تابعینە بەرێزەکاندا هاتوون .

وە هەر مووسڵمانێکیش سوود مەند بوو لە م زانستە با لەبیری نەچێت کە دوعای خێر بۆ برا مووسڵمانەکانی بکات لە دانەرانی ئەم پەرتووکە وە بەهیوام الله عزوجل لێمان وەرگرێ و ڕەزابوونی خۆی ببەخشێ پێمان امین .

لە کۆتایدا دەڵێم : هەرچیمان پێکا بێت لە فەزڵ و منەتی الله تعالی وەیە داوێتی پێمان وە هەر هەڵەیەکیشمان هەبێت بێ گوومان لە تاوانباری خۆمانەوەیە الله تعالی بمان بورێ امین .

[ ٦ی شوال ی ١٤٤٢ کۆچی ]

کۆکردنەوە و نووسینی

موجاهید

## وانەی یەکەم

## ناسخ و مەنسووخ چییە ؟

سەرەتا دەچینە خزمەت قورئان و ئایەتە شەریفەکانی الله عزوجل بزانین چۆن الله تعالی باسی کردووە :

یەکەم : لە سورەتی البقرە ئایەتی ژمارە { ١٠٦ } دا الله عزوجل دەفەرموێت :

{ مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ }

واتە : [هیچ ئایەتێک نەسخ ناکەینەوە یان لە لەبیری نابەینەوە یان بە باشتر لەو ئایەتە دێنین یان هەروەکو خۆی مەگەر نەتزانیوە الله تعالی بەسەر هەموو شتێکدا توانایە ] .

ئەلێرەدا هەم بەڵگەیەکی ڕوونە بۆ زانستی ناسخ و مەنسووخ ، هەمیش واتای چی دا ؟ ناسخ و مەنسووخ یان بڵێین ووشەی نەسخەکە ؟

واتای [ سڕینەوەی ئایەت و گۆڕینی ] وەکو سەیری واتاکەی بکەیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە مەبەست پێی یان ئایەتێکی تر هاوشێوەی دێنین ئەفەرموێ کە ئەمە مانای گۆڕینێتی یان دەفەرموێ نەسخی دەکەینەوە کە نەسخ لێرە دا مانای سڕینەوە دێت ، وەکو چۆن نمونەیەک لە زمانی عەرەبی بێنینەوە :

[نسخت الشمس الظل] واتە : خۆر تاریکی سڕیەوە یان خۆر کەدەردەکەوێ تاریکی نامێنێ بێ گومان

ئێستا لەم نموونەیەدا لە قورئان بۆمان دەرکەوت کە مەعنایەکی [ نەسخ ] چی یە؟مەعنای سڕینەوە یان گۆڕینە کە هەشمانە و لە ئایەتەکان دێینە سەری .

دووەم : الله عزوجل لە شوێنێکیتر لە سورەتی الجاثیە ئایەتی ژمارە {٢٩} دا دەفەرموێت : { هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ } پێیان ئەوترێ: ( ئەمە کتێبی

ئێمەیەو فریشتەکان تۆماریان کردووە، بە دادگەرانە شایەتیتان لەسەر ئەدات ) .

{ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ } بێگومان ئێوە هەرشتێکتان دەکرد، ئێمە ئەمان نووسی واتە: فریشتەکان بە فەرمانی خۆمان، نوسخەیان لەبەر دەگرتەوە .

ئەلێرە دا واتای چی دا ؟ واتای [ نووسینەوە و گواستنەوە ] ئەگەر لە ئایەتەکە ووردبیتەوە بۆت دەردەکەوێ کە ئەو دیمەنە کاتێکە کە فریشتە بەرێزەکان باسی کردەوەکانی مرۆڤ دەکەن کە نووسیوویانەتەوەو گواستوویانەتەوە بۆ الله تعالى و لە ساحەی مەحشەردا وا پیشان دەدرێ .

هەروەکو چۆن عەرەب دەڵێت : [ نسخت الكتاب ] واتە چۆن ئێستا خۆمان دەڵێین فۆتۆ کۆپی یان کۆپیمان کرد ، پووختە ئەوەیە کە لێرە دا مانای [ نوسینەوە و گواستنەوەی دا ] .

سێیەم : لە شوێنێکی تری قورئاندا الله تعالى لە سورەتی النحل ئایەتی ژمارە {١٠١} دا دەفەرموێت :{ وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ ۙ } واتە : هەر کات ئێمە ئایەتێک بە ئایەتێکی تر بگۆڕین و لابەرین ، وە یان ئایەتێکی تر لەجێی ئەو دابنێین { وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ } و الله تعالى بۆ خۆی زاناترە بەوەی دایدەبەزێنێ .

لێرە دا واتای چی دا ؟

بێ گومان لێرە دا زۆر بەڕوونی واتای[ جێگۆڕین ] ی دا یان زۆر جار دەبیستین هەر ووشە عەرەبیەکەش لە ناو خۆماندا باوە کە دەڵێن [ تبديل ] واتە ئایەتمان هەیە لە قورئاندا جێگۆڕکێ ی پێ کراوە ان شاء الله لە نموونەکان زیاتر ڕوون دەبێتەوە .

هەروەکو چۆنیش عەرەب دەڵێ [ نسخ شئ بالشئ ] واتە تەبدیلی شتێک بە شتێک.

چوارەم : الله تعالى لە شوێنێکی تری قورئاندا لە سورەتی الرعد لە ئایەتی ژمارە

{٣٩} دا دەفەرموێت :{ يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ }واتە : هەرچی لەو بڕیارە کاتیانەیە کە الله تعالى پێشتر بۆ پێغەمبەرانی ناردووە ، هەرکامێکیانی ویستبێ لای بدا ئەوا لایداوە و سڕییویەتەوە { وَيُثْبِتُ ۖ } هەرشتێکیشی ویستبێ بیهێڵێتەوە ، ئەوا بۆکاتی

دیاریکراوی خۆی هێشتوویەتەوە و نەیگۆڕیوە (ئیبن عەبباس) و (موجاهید) دەڵێن: بێجگە لەژیان و مردن، خۆش بەختی و بەدبەختی ئیتر هەر شتێکی تر کەخۆی حەزبکا دەیسڕێتەوە، بەڵام ئەو جۆرە شتانە قەڵەمی ئەزەلی بەسەریاندا تێپەڕییوە و ناسڕێنەوە { وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ } وە دایک و سەرچاوەی هەموو کتێبە ئاسمانیەکان و (لوح المحفوظ) لای خوای گەورەیە، کەوابوو هیچ کەسێک بۆی نییە دەسکاری هیچ بڕیارو حوکمێکی الله تعالی بکاو شتێکی تر بخاتە شوێنی و الله اعلم .

لێرە دا واتای چی دا؟

بێ گوومان ڕوونە واتای[ سڕینەوەی ] دا واتە ئایەتیشمان هەیە سڕاوەتەوە وەکو لەوانەکانی داهاتوو دێینە سەری ان شاء الله .

## وانەی دووەم

## پێناسەی ناسخ و مەنسوخ

١-المنسووخ : واتە ئایەتی سڕاوە یان هەڵگیراو یان ئایەتی گۆڕاو واتە ئەو ئایەتەی کە لە سەرەتادا هاتووەو پاشان ئایەتێکی تر بە دوایدا هاتووە و نەسخی کردۆتەوە.

٢- الناسخ : واتە ئەو ئایەتەی کە جێگیر بووەو بەدوای ئایەتەکەی پێش خۆیدا هاتووەو سڕیویەتەوە یان لە کاری خستووە ، وە هەروەها بەرزکردنەوە یان سڕینەوە یان گۆڕینی حوکمێکی شەرعی بە دەلیلێکی شەرعی کە لە دوای خۆیەوە هاتبێ بەم مەرجانەی خوارەوە :

یەکەم : دەبێ ئەو دەلیلە شەرعییە ی یان ئەوئایەتەی کە ئایەتێکی تر نەسخ دەکاتەوە لە ڕیزبەندی دابەزینی وەحیدا لە دوای خۆیەوە هاتبێ واتە [ ناسخ دەچێتە سەر مەنسووخ نەک بە پێچەوانەوە ] .

دووەم : لە یەکیان دووربخاتەوە نەک کۆیان بکاتەوە .

سێیەم : ناسخ و مەنسووخ دەبێ هەردووکیان لە سەر یەک بابەت بن نەک دووبابەتی جیاواز ، بۆ نموونە ئایەتە مەنسووخەکە باسی میرات دەکات دەبێ ئایەتە ناسخەکەشی باسی میرات بێت نەک بابەتێکی تر ، بۆ نموونە سەیری ئەم دوو ئایەتەی خوارەوە کەن کە یە کەمیان مەنسووخە و دووەمیان ناسخە :

{ وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ }

لێرەدا الله ئەفەرمێ چی ؟

ئەفەرمێ ڕوو لە هەرلایەک بکەن لە کاتی نوێژدا بۆ ئێوە مزگەووتە بێ گوومان وەکو ڕوونە مووسڵمانان سەرەتا ڕوویان لە بیت المقدس دەکرد لە کاتی نوێژدا

بە ڵام دواتر ئایەتێکی تر بە دوای دا دێت و ئەمر بە مسجد الحرام دەکات کە ڕووی تێ بکەین واتە مەککەی ئێستا کە بوو بە قیبلەی مووسڵمانان :

{ قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ } [البقرة:١٤٤]

بینیت چۆنە؟

لێرە دا ئایەتی سەرەوە کە سەرەتا باسی ئەوەی دەکرد ڕوو لە هەر شوێنێک بکەین مزگەووتە بۆمان پێی دەووترێت [ مەنسووخ ] واتە کاری پێ ناکرێت

بەڵکو کار بەئایەتی دووەم دەکرێت کە پێی دەوترێت [ ناسخ ] .

## وانەی سێیەم

## جۆرەکانی ناسخ و مەنسووخ

**زۆر گرنکە بزانی چەن جۆرمان هەیە کە ئەمانەن :**

**یەکەم : ئایەتمان هەیە [ نووسینەکەی و خوێندنەوەکەی ماوە لە قورئاندا بەڵام حوکمەکەی هەڵگیراوەو کاری پێ ناکرێت ] چۆن ؟**

**وەکو ئەم ئایەتە:{ وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا } {١٥} النساء**

**واتە : ئەوانەی زینا و داوێن پیسی دەکەن چوار شاهێدیان لەسەر بێت لەماڵەکاندا سجنیان کەن تامردن یان الله تعالی ڕێگایەکیان بۆ دەکاتەوە .**

**بەڵام ئەم ئایەتە مەنسووخە بە ئایەتی(٢) ی سورەتی النور :**

**{الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ} {٢}**

**واتە : زیناکەران چ کوڕ بن یان کچ هەریەکەیان سەد جەڵدیان لێ بدەن وە هیچ بەزەییەک نەتان گرێ لەکاتی جێ بەجێ کردنەکەدا ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەالله تعالی و ڕۆژی دوای هەیە وە با کۆمەڵێک لە مووسڵمانانیش شاهید بن لەکاتی لێدانیان.**

**تێبینی: ئەم حوکمە تەنها بۆ کوڕ و کچە کە پێشتر زەواجیان نەکردووە ، بێوە ژن و بێوە پیاویش ناگرێتەوە تەنها کوڕو کچ دەگرێتەوە . وەپاشان کەسی ئازادبن واتە کۆیلە نەبن ، وە کەسی عاقڵیش بن واتە ئەم حوکمە لەسەر شێت و کۆیلە جێ بەجێ ناکرێ والله اعلم .**

جۆرى دووەم : ئايەتمان هەيە بەپێچەوانەى جۆرى يەكەم

[ نوسين و خوێندنەوەكەى نەماوە واتە لە قورئاندا نى يە بەڵام حوكمەكەى ماوەو ئايەت بووە پێشتر ] چۆن ؟؟

ئەويش حوكمى پياو و ژنە كە زينا بكەن بۆ وەژن و بێوە پياويش دەگرێتەوە واتە هەر يەك جار داخلى پرۆسەى هاوسەرگيرى بووى بە پياو يان بە ژن ئەوا دەى گرێتەوە .

ئايەتەكەش كە نوسينەكەى نەماوەو حوكمەكەى ماوە ئەمە يە :

روى البخاري (٦٨٣٠) ومسلم (١٦٩١) عن ابن عباس رضي الله عنهما أن عمر بن الخطاب صعد المنبر فخطب الجمعة ، وكان مما قال رضي الله عنه فقال : (إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَقِّ ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ ، فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ آيَةُ الرَّجْمِ ، فَقَرَأْنَاهَا ، وَعَقَلْنَاهَا ، وَوَعَيْنَاهَا ، رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ : وَاللَّهِ مَا نَجِدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللَّهِ ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ ، وَالرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أُحْصِنَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ ، إِذَا قَامَتْ الْبَيِّنَةُ ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ ، أَوْ الِاعْتِرَافُ) .

واتاكەى : تەبعەن لەبوخارى بەو ژمارەى سەرەوەو لە مووسليم يش بەو ژمارەيەى سەرەوە هاتووە [ كە لە ابن عباسە وە ئامۆزاى پێغەمبەرمان ( صلى الله عليه وسلم ) كە ئەفەرموێ عومەرى كوڕى خەتاب لە ڕۆژى جومعەدا سەركەووتە سەر مينبەرو خوتبەى دا تێيدا ووتى :[ بێ گومان الله تعالى محمدى بۆناردين بەڕاستى يەوە ( صلى اللهعليه وسلم ) وە قورئانيشى لەسەر دابەزى ، وە تێيدا ئايەتى ڕەجم واتە بەردباران كردن دابەزى خوێندمانەوە و لێشى تێگەيشتين و وە ڕەچاويشمان كرد واتە جێبەجێمان كرد پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) خۆى ڕەجمى كردووەو وە ئێمەش كردمان لەدواى ئەو ، وە ئەترسم زەمان درێژە بكێشێ بەسەرتانداو خەڵكانێك پەيدابن و بڵێن ئێمە ئايەتى ڕەجممان نەديووە لە قورئاندا وە گومڕا

ببن بەتەرک کردنی ئەو فەرزە کە الله تعالی دای بەزاندووە ، وە ڕەجم بەردباران کردنی پیاو و ژنی زیناکەر حەقە ئەگەر ڕوون بۆیەوە لەسەریان کەکردوویانە. ]

ئەمە نموونەیەک بوو لە و جۆرەی نەسخ کە نووسینەکەی لە قورئاندا نەماوە بەڵام حوکمەکەی ماوە کە ئەمەش حیکمەتی خۆی هەیە و دواتر باسی دەکەین.

جۆری سێیەم : سێیەم جۆری ناسخ ومەنسوخ کە هەمانە ئەویش ئەوەیە کە

[ نە نووسینەکەی ماوە نەحوکمەکەشی ماوە ]

واتە ئایەت بووە پێشتر دابەزی وە دواتر سڕاوەتەوە یان بڵێین هەڵگیراوەتەوە نەلەنووسین ماوە نە لە قورئان نە لە حوکمیش وەکو :

[ كانَ فِيما أُنْزِلَ مِنَ القُرْآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ، بخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، وَهُنَّ فِيما يُقْرَأُ مِنَ القُرْآنِ ]

الراوي : عائشة أم المؤمنين | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم الصفحة أو الرقم: ١٤٥٢ | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

واتە :[قورئان دابەزی کە بە دە جارشیرپێ دان حەرام دەبێ نیکاح لەبەینی کچ و کوڕ کە هەردووکیان لە یەک کەس شیریان وەرگرتبێ ، پاشان سڕانەوە بە پێنج جار شیرپێدان وە کاتێک پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەفاتی کرد بەو شێوەیە لەناومان دەخوێنرایەوە واتە پێنج جار ]

کەواتە دە جار شیرپێدانەکە نەنووسینی ماوە ئێستا نە حوکمیشی پێ دەکرێ

نموونەی تریش هەیە کە أنس ئەیگێڕێتەوە کە پێشتر ئایەت بووە و دواتر سڕاوەتەوە.

ئەمە هەرسێ جۆرە کە بوو بۆ هەریەکێکیان یەک نموونەم دانا بەڵام نموونەی تریش هەن .

## وانەی چوارەم

## اَلتَخصِیصْ

بابەتێکی زۆرگرنگ کە پێی دەووترێت [ التخصیص ] لەناو زانستی ناسخ و مەنسووخدا واتا ( تایبەت مەندێتی ) یان ( تایبەت ) واتا گشتی نییە پێوویسە بزانی ئەمە چییە ، دووبارە دەبێ ئاگاداربیت ئەم ئایەتانە کە زۆر زانا لە کتابەکانیاندا بەبێ هیچ دەلیێکی شەرعی بە مەنسووخ ناویان بردووە کە مەنسووخیش نین و پێیان ناوترێ مەنسووخ بە کوردی و پووختی ئەمانە پێیان دەووترێ [تخصیص] .

کە ناچێتە سەر [أمر ونهی ] بەڵکوو دەچێتە سەر ڕستەی خەبەری و هەواڵێک دەدا پاشان هەواڵەکە [ استثناء] ی تیایە واتە ئەم ئەداتانەی تیایە [إلا، غیر، سوی، خلا، عدا، حاشا] لە کۆتایدا لە دوای ئایەتە مەنسووخەکانی قورئان بە چەند نموونەیەکی قورئانی ڕوونی دەکەینەوە بۆ زیاتر تێگەیشتن بەڵام مەنسووخ نین ، چونکە زۆر زانای سەردەمەکانی دوای پێشینە چاکەکان کتێبیان نووسیوە لەم بواری زانستی ناسخ و مەنسووخە ئاماژەیان بە زۆر ئایەت داوە کە گوایە مەنسووخن بەبێ ئەوەی ڕوونی بکەنەوە کە ئەو ئایەتانە گشتی نین و تایبەت مەندێتیان هەیە ، بۆیە کاتێک فێرخوازی زانست ئەگەر سەربەخۆ بچێ کتێبی یەکێ لەوانە بخوێنێتەوە زۆر خراپ تێدەکەوێ بۆیە دەبێ بزانی زۆر ئایەت هەن بە مەنسووخ ناوبراون کە هیچ دەلیلێکی شەرعی لەسەر نییە بەڵکو پێوویستی بە ڕوون کردنەوەیە وە پێشی ناووترێ ئایەتی مەنسووخ بۆ نموونە

سەیری ئەم سێ ئایەتە شەریفە بکەن کە بەدوای یەکدا هاتوون :

{ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ } (٨٦) ال عمران

{ أُولَٰئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ } (٨٧) ال عمران،{ خَالِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ } (٨٨) ال عمران

که هەرسێکی له سورەتی ال عمراندا هاتووه هەمووی وەعدو هەڕەشه یه بۆ کافران و دووڕووان ، بەڵام هەندێک بەبێ ئەوەی باسی ( تخصیص ) واته (تایبەتمەندێکەی) بکەن دێن دەڵێن چی؟ دەڵێن ئەو سێ ئایەته مەنسووخه . بۆچی ؟ دەڵێن بەئایەتی دوای خۆی که ئەم ئایەتەیه :

{ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ } (٨٩) ال عمران

له کاتێکدا تایبەتمەندیەکەی ئەوەیه که له سەرەتای ئایەتەکه دەفەرموێ { إلا الذين تابوا } واته : تەنها ئەوانەی تەوبه دەکەن و کاری چاک دەکەن له دوای تەوبەکه ئینجا الله تعالی لێیان خۆش دەبێ به میهرەبانی خۆی ، واته مەرجی هەیه.

بۆ یه ئەم جۆره ئایەتانه که [ الا یان فإن یان اذا ] زۆری تر هەبوو له ئایەتەکانی ناسخ دا ئەمه پێی ناوترێ ئایەتی پێش خۆی مەنسووخ کردۆتەوه

جا ئەمه نموونەیەک بوو زۆر نموونەی ترهەن ئەگەر وورد بیتەوه له قورئان ، جابۆیه بزانه که [ تخصیص ( تایبەتمندێتی) ] چی یه پێش ئەوەی بچیته ناو زانستەکەوه، الله تعالی هیدایەتی منیش و ئێوەشبدات امین .

## وانەی پێنجەم

## حیکمەتەکانی ناسخ و مەنسوخ

حیکمەت یان بڵێین مەبەست له ئایه تی مەنسووخ چی یه ؟

واته هەموومان دەزانین که الله تعالی هەموو ئایەتەکانی حیکمەتی گەوره گەورەی تیایه که لێ ی وورد دەبیتەوه .

جابێ گومان هەموو فێرخوازێکی زانستی شەرعی ئەم زانستەش ئەو پرسیارەی بۆ دروست دەبێت که حیکمەت لەوه چی یه که الله تعالی هەندێ ئایەتی پێشتر دابەزاندووه و پاشان هەڵیگرتۆتەوەو ئایەتی تر به دوایدا هاتووه ؟

وه بێ گومان شەیتانیش واز له ئیشی خۆی ناهێنێ كه وەسوەسه درووست كردنه بۆ مرۆڤەكان بۆیه بۆ جوابی وەسوەسەكان و ڕوون بوونەوەی حیكمەتی ئەم زانسته سەیری ئەم خاڵانەی خوارەوەكەن :

یەكەم : یەكەمین حیكمەت تاقی كردنەوەی مووسڵمانانه و دەبێ مووسڵمان ووریابێت چۆن؟

بۆ نموونه ئایەتی ڕەجم كه نووسین و خوێنەوەی نەماوه له قورئاندا بەڵام پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )ئاگاداری كردوینەتەوه كه ئەوه حوكمێكی شەرعی یه و خۆی جێ بەجێ ی كردووه و پاش خۆشی جێ بەجێ كراوه و له قورئانیشدا نییه حیكمەت لێرەدا الله تعالى بەندەكانی تاقی دەكاتەوه بزانن وەك چۆن گوێڕایەڵی الله تعالى ین به هەمان شێوه گوێڕایەڵی نێردراوەكه شی دەكەین یان نا؟

چونكه خۆی وەسفی پێغەمبەر دەكات و دەفەرموێت الله عزوجل :

{ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ } النجم {٣} {٤} .

واتا : هیچ شتێك ناڵێ له هەوای نەفسی خۆیەوه بەڵكو ئەوەی دەیڵێ وەحییەو بۆی كراوه .

وەكوو له چەندین ئایەتیش الله تعالى باسی كردووه و ئەفەرموێ :

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا } (٥٩) النساء .

وه بۆ تاقی كردنەوەی مرۆڤەكانیش شتێكی ڕوونه چونكه الله عزوجل خۆی دەفەرموێ :{ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ } {٢} الملك. واتا: بۆ ئەوەی تاقیتان بكاتەوه كامتان باشترین كاری بۆ دەكەن .

بێ گومان ئەمەش كه باسمان كرد لەسەرەوه یەكێكه له تاقی كردنەوەكان كه زۆرترین خەڵكی بەناو مووسڵمان تێی كەووتوون كافربوونەتەوه هەر لەم

سەردەمەی خۆماندا کەسانێک هەن بە ئاشکرا بەرنامە پێشکەشدەکەن و زۆر بەی زەندیقی ئینکاری ئەم جۆرە حوکمانە و ئەم جۆرە فەرموودانە دەکەن وەکو [ عدنان ابراهیم ] ی لەعین و شوێن کەووتوانی کە ئێستا شوێن کەووتەی ناو قەومی خۆشماندا هەیە کە گوایە زۆر کابرایەکی زیرەکەو ئەم شتانە بە ئاشکرا بینیوومە سووکایەتی بەم فەرموودەی ڕەجم کردووە و بە پێکەنینەوە ئەڵێ بوخاری وا ئەڵێ وەک ئەوەی بڵێی بوخاری و نموونەی بوخاری وەک ئەم بێ ئەدەب و بێ عیلمانە بوونە پەنا بە الله عزوجل .

پاشان سەردەمی پێغەمبەریش مونافیقەکان هەبوون بەردەوام ئەم گومان و وەسوەسانەیان دەدا بە گوێ ی مووسڵمانانداا وەکو لە سورەتی ( التوبە ) دا باسیانی کردووە و دەفەرموێ :

[ وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ ] {١٢٤} توبة . وە هەرکە بەشێک لە قورئان دێتە خوارێ [فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَـٰذِهِ إِيمَانًا ] هەندێ لە دووڕووان بەگاڵتەوە بەوی تر دەڵێ: ئاخۆ ئەم سوورەتە باوەڕی کێتان زیاد بکات؟ [فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا ] جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە [فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا] ئیمان و بیروباوەڕیان زیاد دەکات

[ وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ] و بەهاتنەکەشی دڵشادو خۆشحاڵدەبن .

دووەم :دووەمین حیکمەت ئەوەیە کە الله تعالی ویستو ڕەحمەتی هەبووە بە مووسڵمانان هەندێک حوکمی قورسی گۆڕیوە بە ئاسان بۆمان وەکو سووک کردنێکی سەرشانی مووسڵمانان و ڕەحمەت و میهرەبانیەک لەلایەن الله عزوجل ە لەوە وەکو ئەم دوو ئایەتە بۆنموونە سەرەتا ئایەتی :

{ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ }البقره ( ٢٤٠ )

که باسی ژنو پیاوی مردوو دەکات لێرەدا وەسیەتی بۆ دەکرێ تا ساڵێک (حول) واته ساڵێک لێرەدا بهێڵرێنەوەو خزمەت بکرێن واته بۆیان نییه تا ساڵێک شوو بکەنەوه .

بەڵام دواتر الله تعالی سووکی کرد بۆیان و کردی به چوار مانگ و ده ڕۆژ وەکو لەم ئایەتی خوارەوه :

{ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا } البقره (٢٣٤)

ئەمه پێی دەڵێن سووک کردن بۆیان واته له ساڵێکەوه هاته سەر چوار مانگ و ده ڕۆژ ئەمەش حیکمەتێکی تر .

تێبینی : ئایەتی یەکەم که مەنسووخه به ژماره ٢٤٠ هاتووه مەعنای ئەوه نییه دوای ئایەتی ناسخ کەووتووه که ژماره ٢٣٤ نەخێر بەڵکو ئەوه بابەتێکی تره که ڕوون کردنەوەی له سەر دەدەین ان شاءالله .

سێیەم : سێیەم حیکمەتیش له هەندێک ئایەتی حوکمی سووک که گۆڕدران بۆ حوکمی قورس واته به پێچەوانەی حیکمەتی دووەم که ئەمەیان خێری ئاخیرەتی تیایه که بۆنمونه :

[ ئایەتی ژن و پیاوی زیناکەر که سەرەتا باسمان کرد سجن کردنیان بوو له ماڵەوه تا مردن تەبعەن ئەو کات ئایەتی جەڵد لێدان بۆ کچ و کوڕیش نەهاتبوو واته بۆ کچ و کوڕ و ژن وپیاو هەمان حوکم بوو سجنکردنیان بوو لەماڵەوه تا مردن بەڵام هی ژن وپیاو گۆڕردا بۆ ڕەجم تا مردن ]

که ئەمه له چاو سجنەکه وه قورس تره له پێش چاو بەڵام پاک بوونەوەی تیایه و ئەو مووسڵمانەی ڕەجم دەکرێ پاش ئەوەی که خۆیشی له دڵەوه پێی ڕازی یەو خۆشحاڵیشه بەو حوکمه پاک دەبێتەوەو الله تعالی لێی خۆش دەبێت ان شاء الله .

ئینجا بیهێنه پێش چاوی خۆت حوکمی زینا لەم دونیا ئاوا قورس بێت

ئەی ئەبێت ئەگەر لەم دونیا ڕەجمەکە نەبینێ و بچێتەوە لیقای الله تعالی و تەوبەی نەکردبێ سزاکەی چەن قورس تردەبێت پەنا بەالله عزوجل بێ گومان سزای ئەو دونیا شتێکی ترە و قورس ترە والله اعلم .

بەڵێ ئەمەش حیکمەتی سێیەمی زانستی ناسخ و مەنسووخ بوو کە پاک بوونەوەی مووسڵمانانی تیایە و ڕەحمەتێکی الله تعالی یە بۆ مووسڵمانان کە هەر لەم دونیا بە و حوکمە پاکیان دەکاتەوە بە وویستی خۆی .

## وانەی شەشەم

## ڕیزبەندی سورەتەکانی قورئان بە پێی دابەزینی بۆسەر پێغەمبەرمان ﷺ

سورەتەکان بەپێی ڕیزبەندی دابەزین .

ئەمەش پێوویستە بزانرێت کە ئەو قورئانەی ئێستا بەردەستە و دەخوێنرێتەوە واتای ئەوەنییە بەپێی دابەزین بەو شێوەی کەنووسراوە ئێستا وابێت کە قورئان دەکەیتەوە سەرەتاکەی الفاتحە یەو کۆتاییەکەی  الناس ە ، نا نەخێر ئەوە کۆتا جار کە جوبرائیل ( علیە سلام )بەسەر پێغەمبەرمان (صلی الله علیە وسلم) خوێندییەوە بەو شێوەیە بوو ، بەڵام کات و شوێنی دابەزین بەپێی ڕیزبەندی بەشێوەیەکی ترە کە پێویستە بیزانی لە م جەدوەلەی خوارەوە ئەویش بەم شێوەیە بووە  :

| ناو | شوێن | ناو | شوێن | ناو | شوێن | ناو | شوێن | ناو | شوێن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 علق | مكية | 14 عاديات | مكية | 27بروج | مكية | 40 الجن | مكية | 53يوسف | مكية |
| 2قلم | مكية | 15 كوثر | مكية | 28 التين | مكية | 41 يس | مكية مدنية | 54 حجر | مكية |
| 3مزمل | مكية | 16 تكاثر | مكية | 29 قريش | مكية | 42 فرقان | مكية | 55 الأنعام | مكية |
| 4 مدثر | مكية | 17 ماعون | مكية | 30 قارعة | مكية | 43 فاطر | مكية | 56 صافات | مكية |
| 5 فاتحة | مكية مدنية | 18 كافرون | مكية | 31 قيامة | مكية | 44 مريم | مكية | 57 لقمان | مكية |
| 6 مسد | مكية | 19 فيل | مكية | 32 همزة | مكية | 45 طه | مكية | 58سبأ | مكية |
| 7 التكوير | مكية | 20 فلق | مكية | 33مرسلات | مكية مدنية | 46 واقعة | مكية | 59 الزمر | مكية |
| 8 الأعلى | مكية | 21 الناس | مكية | 34 ق | مكية | 47 شعراء | مكية | 60 غافر | مكية |
| 9 الليل | مكية | 22 الإخلاص | مكية | 35 البلد | مكية | 48 النمل | مكية | 61 فصلت | مكية |
| 10 الفجر | مكية | 23 النجم | مكية | 36 الطارق | مكية | 49 قصص | مكية | 62 شورى | مكية |
| 11 ضحى | مكية | 24 عبس | مكية | 37 القمر | مكية | 50 الإسراء | مكية | 63 زخرف | مكية |
| 12شرح | مكية | 25 قدر | مكية | 38 ص | مكية | 51 يونس | مكية | 64 دخان | مكية |
| 13 عصر | مكية | 26 شمس | مكية | 39 الأعراف | مكية | 52 هود | مكية | 65 جاثية | مكية |

| ناو | شوێن | ناو | شوێن | ناو | شوێن | ناو | شوێن | ناو | شوێن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 66الأحقاف | مكية | 76 الطور | مكية | 86 مطففين | مكية | 97 الرحمن | مدنية | 107 تحريم | مدنية |
| 67ذاريات | مكية | 77 الملك | مكية | 87 بقرة | مدنية | 98 الإنسان | مدنية | 108 تغابن | مدنية |
| 68 غاشية | مكية | 78 الحاقة | مكية | 88 الأنفال | مدنية | 99 الطلاق | مدنية | 109 الصف | مدنية |
| 69 كهف | مكية | 79 المعارج | مكية | 89 آل عمران | مدنية | 100 البينة | مدنية | 110جمعة | مدنية |
| 70 نحل | مكية | 80 النبأ | مكية | 90 الاحزاب | مدنية | 101 الحشر | مدنية | 111 فتح | مدنية |
| 71 نوح | مكية | 81 نازعات | مكية | 91 ممتحنة | مدنية | 102 النور | مدنية | 112مائدة | مدنية |
| 72إبراهيم | مكية | 82 الأنفطار | مكية | 93 الزلزلة | مدنية | 103 الحج | مدنية | 113 توبة | مدنية |
| 73 الأنبياء | مكية | 83 الانشقاق | مكية | 94 الحديد | مدنية | 104 منافقون | مدنية | 114نصر | مدنية |
| 74 مؤمنون | مكية | 84 الروم | مكية | 95 محمد | مدنية | 105 مجادلة | مدنية | | |
| 75 سجدة | مكية | 85 عنكبوت | مكية | 96 الرعد | مدنية | 106الحجرات | مدنية | | |

## وانەی حەوتەم

وەکو ئاماژەمان پێدا لە پێشوودا کە دەبێت ئایەتی ناسخ دوای مەنسووخ هاتبێ بەڵام لە قورئاندا نموونەیەکمان  هەیە کە ئایەتی مەنسووخ کردۆتەوە بەڵام لە ڕیزبەندی ئەو قورئانەی ئێستا بەردەستە بە ژمارە کەووتوونەتە پێش ئایەتە مە نسووخەکە ، کە  ئەمەش بەواتای ئەوە نایەت کە ناسخ پێش مەنسووخ کەووتبێ نەخێر بەڵکوو لە وانەی (شەشەم) ئاماژەمان پێکرد دابەزینی ئایەت و سورەتەکان بەشێوەەکی تر بووە نەک ئەوەی ئێستا لە قورئاندا هەیە و لەبەردەستە.

نموونەش بۆ ئەو  ئایەتەی کە کەووتووەتە پێش مەنسووخ لەم قورئانەی بەردەستمان کە پێی دەووترێت سێیەم مراجەعەی جبریل علیە سلام بەسەر پێغەمبەرمان ( صلى الله عليه وسلم ) نموونەکەش ئایەتی ژمارە(٢٣٤)ی سورەتی البقرة ناسخە بۆ ئایەتی ژمارە(٢٤٠) ی هەمان سورەت کە وا دەردەکەوێت بە ژمارەی ئایەت کە ناسخ  پێش مەنسووخ کەووتبێ بەڵام وانییە وەکو ووتمان دابەزینەکەی سەرەتای وانەبووە بەڵکو ناسخەکە لە دوای مەنسووخەکەوە هاتووە والله اعلم .

## وانەی هەشتەم

پاشان ئەوەی ئەمێنێتەوە بۆ ئامەژە پێکردن لەسەر ئەم بابەتە ئەومیە کە ( نەسخ ی ئایەت تەنها بەئایەت دەبێت ) جگە لەوە شتی تر نابێت وەکو زۆر کەس دەڵێن و ووتووشیانە فەرمووده ئایەت  نەسخ دەکات پەنا بەالله عزوجل یان اجماع و ئەو شتانە زۆر ترسناکن و دە بێ زۆر ووریا بیت نەسخی ئایەت تەنها بە ئایەت دەبێت و بەس هیچی ترنابێت ، وە بەڵگەشمان لە قورئان هەیە بۆ ئەمە  بە پشت بەستن بەم ئایەتەی خوارەوە :

{ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ ۙ} یونس { ١٥} هەرکە ئایەتە روونەکانمان بۆیان بخوێنرێتەوە { قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا } ئەوانەی کە ئومێدیان بەلێقاو دیداری

ئێمە نییە دەڵێن: { ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَٰذَا أَوْ بَدِّلْهُ } جگە لەم قورئانە نامەیەکی ترمان بۆ بێنە ، یان هەربیگۆڕە بەشتێکی تر واتە : دەبێ گەلێ شت دەسکاری بکەیت بۆمان ، حەرامەمانی بۆ حەلاڵ کەیت یان بە پێچەوانەوە { قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِي } پێیان بڵێ : هەرگیز من لەخۆمەوە بۆم نیە بیگۆڕم چونکە ئەمە بەرنامەو شەریعەتی الله تعالی یە ، کاری من نیە دەسکاریکردنی واتە: تەنانەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) بۆی نیە دەسکاری قورئان بکا ، بەڵام بەیناو بەین الله عزوجل بەویستی خۆی لەبەر ئەوحیکمەتەی خۆی دەیزانێ ئەوکارە دەکات بۆ نمونە: لە سوورەتی (١٠١/١٦)دا دەفەرموێ : { وإذا بدلنا آية مكان آية والله أعلم بما ينزل.. } .

وە خاڵێکی تریش ئەوەیە کە دەبێ بزانی ناسخ و مەنسووخ تەنها لە [ أمر و نهي ] دا هەیە واتە بکە و مەکە ئەوانەی کە فەرمانی پێ کراوەو ئەوانەی قەدەغە کراوە تەنها ئەچێتە سەر ئەو دووبابەتە .

بەهیچ شێوەیەک ناسخ و مەنسووخ لە بابەتی عەقیدە و ناو و سیفاتی الله عزوجل و شتی تردا نییە پەنا بە الله تعالی دەبێ زۆر ووریا بیت ، بەڵام ئەوەی هەندێک کتێب و هەندێک زانا ئاماژەیان بە ڕستەی خەبەری داوە گوایە ئەچێتە سەر ئەو هەواڵە خەبەریانەش ، ئەوەیان بابەتێ ترە و ناسخ و مەنسووخ نییە ئەوەیان پێی دەووترێت [ التخصيص ] وەکو پێشتر ئاماژەمان پێ کرد .

تێبینی:

وەکو پێشتر باسمان کرد لەوانەکان هەندێ ئایەت هەن (تخصیص)ن نەک مەنسووخ واتە ڕوونکردنەوەی دەوێ و عام نین جابۆیە لێرەدا تەنها ئاماژە بە ئایەتە مەنسووخەکان دەدرێت لە کۆتایدا بەچەند نموونەیەک باسی چەند .ئایەتێکی (تخصيص)یش دەکەین.

## { ئایەتە مەنسوخەکانی سورەتی البقرة }

سورەتی (البقرە) مەدەنییە و لە مەدینە دابەزیووە واتە دوای کۆچ دوو سەد و هەشتاو شەش ئایەتەو هەم ناسخی تیایە هەم مەنسوخ .

{ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالنَّصَارَىٰ وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَاهُمْ يَحْزَنُونَ} البقره٦٢

مەنسوخە چونكە لێرەدا باسی اهلی كتاب و صابئين ەكان كە لەوانەیان باوەڕی بە الله عزوجل و ڕۆژی دوای هەیە پاداشتیان لای الله تعالی یەو ترسیان لەسەر نی یە بەڵام دواتر ئەم ئایەتەی خوارەوە دابەزی كە ئەو ئایەتەی سەرەوە ی مەنسووخ كرد بەئایەتی(٨٥)ی لە سورەتی ال عمران

{وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِين}

واتە:هەركەس شوێن غەیری ئیسلام بكەوێ لێ ی قەبووڵ ناكرێ وە لە ڕۆژی دوایدا لە خەسارەوەمەندانە

وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ ۚ {فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} (١١٥)البقرة مەنسووخە ئەوەندەی كە لە نێوان كەوانەكەیە ئەوەی پێشتری وەكو ووتمان باسی { ناو و سیفاتی الله } عزوجل ناسخ و مەنسووخ ناچێتە سەری

ئەوە كاتێك بوو كە مووسڵمانان ڕوویان لە قوودس دەكرد مسجد الاقصى كاتێ كە نوێژیان دەكرد ئێ پاشان گۆڕردرا بە مەككەی پیرۆز واتە قیبلەی ئێستا ئەویش ئەو ئایەتەی كە ئەوەی سەروەی سرپیووەتەوە:

{ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا }وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ} (١١٤) البقرة

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} (١١٤) البقرة

مەنسوخە کە لە پێشتردا ڕۆژوو گیراوە وەک قەومانی پێشوو تر کە شەوەکەشی ، بۆت نەبوو بچیتە لای خێزانت یان دوای نوێژی خەووتنانەوە واتە نوێژی عیشا بەدواوە بۆت نەبوو  نانی تر بخۆی

 بەڵام الله تعالی ڕەحمی لێ کردین و ئایەتی١٨٧ ی  سورەتی البقرە ی ناردوو فەرمووی: { أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُون}

واتە لێرەدا ڕێی دا کە شەوانی ڕەمەزان بچیتە لای خێزانت و خۆراکیش بخۆی ئاسای یە تا خەتی ڕەش و سپی لەیەک جیادەکەیتەوە لە فەجردا.

{ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ }  ئەم بەشەی ئایەتی البقرە لە ئایەتی ١٨٤ تەنها ئەوەندەی نەک گشت ئایەتە تەنها ئەوەندەی کە نووسیوومە کە پێشتر فیدیە هەبووە واتە بریتیدان لەجیاتی ڕۆژێکە بۆکەسێک کە نەیگرێت واتە ئەگەر نەت گرت فیدیەت دەدا بەڵام دواتر مەنسووخەوە بوو سڕاوەتەوە بە ئایەتی دوای خۆی کە ژمارە ١٨٥ دەفەرموێ :

{ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ }

فیدیەکەی نەهێشت ڕەمەزان دەبێ بەڕۆژوو بی تەنها دوو کەس بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن ئەویش بەمەرجێ دوای ڕەمەزان بیگرنەوە ئەوانیش (نەخۆش و ئەوەی لەسەفەردایە).

ئایەتێکی تری سورەتی البقرە ئایەتی (خەمر) بە ژمارە (٢١٩) کەپرسیاری قومارو عارەق و شەرابیان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دەکرد :

{ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ} البقرە (٢١٩)

ئەم ئایەتە مەنسوخە بەسێ قۆناغیش مەنسووخ بۆتەوە لە یەکەم قۆناغ سەیری ئایەتی (٤٣) سورەتی النساء بکە

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا } النساء (٤٣)

لە پێشوودا تەنها فەرمووی سوودی هەیەو زیانیشی هەیە بەڵام زیانەکەی زۆرترە لێرە دا فەرمووی نوێژ مەکەن کاتێ ئەخۆنەوە هاوەڵانیش ئەچوون دوای نوێژی عیشا ئەیان خواردەوە ، جابۆیە ئەمەش واتای ئەو ئایەتەش کە بوو بەناسخی ئایەتی سەرەوە ئەویش هەر مەنسووخ دەبێتە وە بە ئایەتەکانی (٩٠) و (٩١) ی سورەتی المائدە سەیریکە :

{ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ }المائدە (٩٠)

لێرەدا فەرمووی لێی دوورکەوونەوە ، وە لەم ئایەتەی خوارەوەش دەفەرمووێ کۆتایی پێ بێنن :

{ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ } المائدە (٩١)

ئینجا ئەو( فهل انتم منتهون) ە کە بە شێوەی پرسیار دەردەکەوێ مەعنای (انتهوا )ئەدات نەک بەو شێوازی خوێندنەوەیە ئەویش بەشێکی تری تێگەیشتن لە قورئانە کە دەبێ بزانی .

ئایەتی ژن و پیاوی مردوو کە لە ئایەتی (٢٤٠) سورەتی البقرە دا سەرەتا ئەگەر ژنێک پیاوەکەی بمردایە دەبوایە ساڵێکی تەواو دانیشتایەو شووی نەکردایەتەوە :

{ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۚ }

بەڵام مەنسووخ بۆتەوە بە ئایەتی هەمان سورەت بە ژمارە (٢٣٤) ئایەتەکەش:

{ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ } البقرە (٢٣٤)

ئەلێرە دا دەفەرموێ ژنێک پیاوی بمرێ چوارمانگ و دە ڕۆژ با دانیشێ و شوو نەکاتەوە لەدوای ئەوە کێشەی نی یە واتە ساڵەکەی سڕیەوە والله اعلم .

ئاخر ئایەت لە سورەتی البقرە ئایەتی ژمارە (٢٨٤)

مەنسووخ بۆتەوە تەنها بەشێکی نەک گشت ئایەتەکە واتە تەنها ئەوبەشەی سڕاوەتەوە کە دەفەرموێ :{ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ } البقرە (٢٨٤)

واتە : هەرچی لەناخی دڵتان هەیە کە ئەیشارنەوە حیسابی لەسەرە واتە ئەگەر گوناحیش بە دڵ بکەی حیسابت لەسەرە ، پاشان الله تعالی ڕەحمی خۆی دابەزاندو لە لەدوو ئایەت پاش ئەوە فەرمووی :

{ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا } (٢٨٦) البقرە واتە : بەدەر لە توانای کەس تەکلیفی لەسەر نییە ، الحمدلله کە الله تعالی ئەم ڕەحمەتەی دابەزاند ئەگەرنا لەسەر ئەو تاوانانەی کە بە دڵیشماندا دەهات پێش ئەوەی بیکەین هەر حەق و حیسابی لەسەر دەبوو والله اعلم .

## { ئایەتە مەنسوخەکانی سورەتی النساء }

سورەتێکی مەدەنییە یەکەم ئایەت تێیدا سڕابێتەوە ئایەتی ١٥یە ، دیسان ڕەحمەتێکی تری الله تعالی بۆ مووسڵمان سڕانەوەی ئەم ئایەتە بوو :

{ وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا} النساء (١٥)

کە لێرەداو لەسەرەتای ئیسلام کچ یان کوڕ ژن یان پیاو زینایان بکردایە و چوار شاهیدیان لەسەر بگیرایە ئەوە لە ماڵەوە سجن دەکران هەتا مردن بەڵام الله تعالی بە سێ قۆناغ گۆڕی ، چۆن؟

هەرلەدوای ئەم ئایەتە بەژمارە (١٦)ی هەمان سورەت :{ وَاللَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا } دێت ؟

لێرە دا ئەو سجنەی بۆ گۆڕین بە لێدان و تەریق کردنەوە تا تەوبە دەکەن بەڵام ووریابە ئەمەش نەما و سڕایەوە چۆن ؟؟

سەیری سورەتی النور بە ژمارە (٢) کە حوکمی کچ و کوڕ دیاری دەکات و دەفەرموێ : { الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ ۖ} ئەو کچ و کوڕەی زیناو شەرواڵ پیسیی دەکەن، دەبێ لە هەریەکەیان سەد جەڵدە «شەلاق»ی لێ بدەن.

ئەمە تۆڵەی هەر کەسێکە (نێر یان مێ) پێشتر بە شێوەی شەرعیی جووت نەبووبێ ، (واتە: کچ و کوڕ) بن وە ئایەتی ڕەجمیش حوکمی پیاو و ژن دیاری دەکات کە پێشتر ئامەژەمان بە ئایەتی ڕەجم کردووە لە وانەکان ووتمان نووسین و خوێندنەوەی نەماوە بەڵام حوکمەکەی ماوەو جێبەجێ دەکرێت ، وەکو پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم ) دەفەرموێ :[ قال الرسول صلی الله علیه وسلم : الثَّيِّبُ بالثَّيِّبِ، وَالْبِكْرُ بالبِكْرِ، الثَّيِّبُ جَلْدُ مِئَةٍ، ثُمَّ رَجْمٌ بالحِجَارَةِ، وَالْبِكْرُ جَلْدُ مِئَةٍ، ثُمَّ نَفْيُ سَنَةٍ. وفي

روایة: بهذا الإسْنَادِ. غيرَ أنَّ في حَديثِهِما البِكْرُ يُجْلَدُ وَيُنْفَى، وَالثَّيِّبُ يُجْلَدُ وَيُرْجَمُ، لا يَذْكُرَانِ سَنَةً وَلَا مِئَةً.]

الراوي : عبادة بن الصامت | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم

الصفحة أو الرقم: ١٦٩٠ | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

واته : ژن و پیاو ی مووسڵمان زینایان کرد دمبێ یەکی سەد جەڵدیان لێ بدرێ و پاشان بەرد باران بکرێن تامردن .

وە کچ و کوڕی مووسڵمانیش یەکی سەد جەڵدیان لێ دەدرێ و ساڵێکیش شاریەدەر دەکرێن واتە تا ساڵێک نابێت بێتەوە بەو ناوچەیەدا کە لێی نیشتەجێ بووە والله اعلم .

ئایەتی ژمارە (٣٣) تەنها بەشێکی نەک گشتی ئەوبەشەی کەدایدەنێین سڕاوەتەوە ئەویش :{ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ. } (٣٣) النساء

کە باسی میرات دەکات کە ئەوانەش میرات دەبەن کە پێشتر پەیمانتان لەگەڵ بەستوون ئیتر خوێن بێت یان پارە بێت .

کە جاران خەڵک لە جاهیلیدا دوو پیاو سوێندیان دەخوارد لەنێوان خۆیان ئەگەر من مردم تۆ ش بەشداریە لە میراتم و ئەوی تریش بە هەمانشێوە ئیتر ئەوکات شەش یەکی دەدرا بەو کاربرایە لە سامانەکەی

بەڵام سڕایەوە بە ئایەتی (٧٥) ی سورەتی الانفال :{ وَالَّذِينَ آمَنُوا مِن بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَٰئِكَ مِنكُمْ ۚ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ } الانفال (٧٥)

واتە : ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو دوای هیجرەتیان کردو جیهادیان کرد ئەوانە لە ئێوەن وەخزمەکانیش لە ناو ئەواندا ئەولاترن لە کتابی الله تعالی ، وە ئایەتی ژمارە (٤٣) ی سورەتی النساء کە پێشتریش لە سورەتی البقرە بوو بەناسخی ئایەتێک دوای خۆیشی مەنسووخ بۆیە وە بە ئایەتەکانی (٩٠) و (٩١) ی المائدە باسمان کرد.

ئایەتێکی تری النساء بە ژمارە (٩٠) کە مەنسووخە ئەویش :

{ إِلَّا الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا }

کە باسی ئەوکافرو مووشریکانەیە کە عەهدو پەیمان هەبووە لەبەیندا کە شەڕنەکرێ بەڵام وەکو دەزانین لە سورەتی التوبە بە ئایەتی ژمارە (٥) الله تعالی فەرمان دەکات لە گەڵ تەواو بوونی مانگە حەرام کراوەکان ئەو مانگانەی شەڕی تێدا حەرامە مووشریکان بکوژرێن سەیریکە :

{ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ } توبة (٥) ئینجا کە مانگە حەرام و خاوەن ڕێزەکان بڕانەوە ، واتە : ئەوانەی کەجەنگیان تیا قەدەغەکراوە ، کە ئەوانیش ئەم چوار مانگەن : (زیلقەعدە، زیلحەججە، موحەررەم، رەجەب) لەدوای ئەمانە ئەفەرموێ:

{ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ } دەسا ئێوەش لە هەر جێگایەکدا موشریکەکانتان دەستکەوت بەمەرجێ (ژن و منداڵ و گۆشەگیرنەبن) « لە حەرەم و لە دەرەوەی حەرەم ، لەچوار مانگەکان و لەغەیری چوار مانگەکانیشدا» بیانکوژن { وَخُذُوهُمْ } و بیانگرن و «دیلیان بکەن» { وَاحْصُرُوهُمْ } و گەمارۆیان بدەن و»مەهێڵن بەملاو بەولادا بچن» { وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ } وە لەهەموو کەمین و ڕێگەیەکیشدا بۆیان دانیشن { فَإِن تَابُوا } ئینجا ئەر پەشیمان بوونەوە لە هاوبەشدانان بۆ الله تعالی{ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ } و بەرێک و پێکی نوێژیان ئەنجامدا { وَآتَوُا الزَّكَاةَ }و زەکاتیان جێبەجێکرد { فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ } ئێوەیش ڕێگەیان بۆ چوڵ بکەن و «هەقتان بەسەریانەوە نەبێ ، با بێن و بچنە ناو حەرەمیشەوە» { إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ } .

## { ئايەتە مەنسوخەكانى سورەتى المائيده و الانعام }

له سورەتى المائيده (سێ) ئايەتمان هەيه و له الانعام (يەك) ئايەت كه مەنسووخەوه بوونه والله اعلم .

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلَا الْهَدْيَ وَلَا الْقَلَائِدَ ( وَلَا آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ ) يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَانًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا ۘ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ..... المائده (٢)

ئەم ئايەتە شەريفە ئاگاداريە تەنها ئەو بەشەی كه كردومەتە ناو كەوانەكان مەنسووخە نەك گشت ئايەتەكە ، ئەويش پێش سورەتى تەوبه دابەزی كه ڕێی دەدا كافرو مووشريكين بچن بۆحەج بەڵام دواتر سورەتى التوبه دابەزی بەتەواوی ڕێگری له چونی هەموو كافرو مووشريكێك گرت كه بچن بۆ حەج و تەوافی ماڵی الله واته ئەگەر دەسەڵاتى ئيسلامى هەبێت كافرو مووشريك بۆی نييه سەردانى مەككەی ی پيرۆز بكەن وەك ئەوەی ئێستا هەيه به ئاشكرا شيعەكان دەچن بۆ حەج و كەسيش ڕێگريان لێ ناكات ، ئەميش ئەو ئايەتەی كه نەسخى دەكات :

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ۚ } التوبه (٢٨)

واته : [ ئەی ئەوانەی ئيمانتان هێناوه مووشريكەكان پيسن با له مزگەووتى حرام نزيك نەبنەوه لەم ساڵ بەدواوه ]

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ۙ وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَائِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ [ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ ۚ ] إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ( المائده ١٣)

ديسان ئەم ئايەتە شەريفەش تەنها ئەوەندەی له ناو كەوانه كه دامناوه نەك گشتى

تەنها ئەوەندەی ناو کەوانەکە مەنسووخە ، کەلەوێدا ئەمربە پێغەمبەر دەکرێت (صلى الله عليه وسلم) کە لە بەرامبەر ئەهلی کتاب لێخۆش بوو بێت و نەرم و نیان بێت .

بەڵام دواتر مەنسووخە بێت ئەو ئەمرە بە ئەمرێکی تر لە سورەتی التوبە ئایەتی ٢٩:

{ قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ } توبة (٢٩)

کە فەرمان بەکووشتنیان دەکات لێرەدا و تا کاتێک یان جزیە دەدەن و بەسەرشۆڕی و بچووکی دادەیشن لە ژێر دەسەڵاتی مووسڵمانان یان دەکوژرێن ئەهلی کتاب .

واتە لێگەڕان و لێخۆشبوون و وازهێنان نییە لە کافرو جوولەکە ئەگەر دەسەڵاتت هەبێت نابێ بۆخۆیان ئیسراحەت لێی دانیشن و پەیوەندی دیبلۆماسی جۆرەها شتی تری ئەمڕۆ بازرگانی و ئەو شتانە نییە دەسەڵاتت هەبوو ئەبێ یان هەموویان بێنە ژێر ڕکێفی حوکمڕانی ئیسلامی و بەزەلیلی پارە بدەن بەرامبەر دانیشتنیان یان دەکوژرێن بەپێی دەقی ئەو ئایەتە شەریفە ، کە ئەم ئایەتانە هەرگیز چاوەڕێ مەبن لە دەم مەلاو بانگخوازی ئەم سەردەمەی ببیستن بەتەفسیری خۆی .

سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَاءُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ [ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئًا ۖ] وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ المائدە ٤٣

دیسان باسی ئەهلی کتابە کەتەنها ئەوەندەی لەناو کەوانەکە دامناوە مەنسووخە نەک گشت ئایەتەکە ، کە لەوێدا ئەمر بە پێغەمبەر (صلى اللهعليه وسلم ) دەکات الله عزوجل کە ئەگەر هاتن بۆلات یان حوکم بکە لەنێوانیان یان پشتیان لێ بکە بەڵام دواتر بە ئایەتی ژمارە (٤٨)ی هەمان سورەت نەسخ دەبێتەوە سەیرکە :

{ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ } المائده (٤٨).

لێرەدا پشت لێ کردن و وازهێنان نییه لێیان بەڵکو فەرمانی پێ دەکات کە حوکم بکات لە نێوانیان بەوەی کە الله تعالی بۆی دابەزاندووە و دوای هەواو ئارەزوویان نەکەون .

پاشان سورەتی (الانعام ) کە هەر ئەم ئایەتەمان هەیە والله اعلم :

{ وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا } وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَا ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ أُبْسِلُوا بِمَا كَسَبُوا ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ الانعام (٧٠)

دیسان ئەوەندەی ناو کەوانەکە مەنسووخە لەسەرەتاوە نەک گشت ئایەتەکە تەنها ئەو دێڕەی سەرەتای کە دیسان باسی کافرو مووشریکانە کە لێرەدا الله تعالی ئەمر بە پێغەمبەر ( صلی الله علیەوسلم ) دەکات کە واز لەوانە بێنێ کە دینەکەیان بە گاڵتەو گەپ گرتووە واتە حەقت نەبێ بەسەریانەوە بەڵام دواتر سورەتی التوبە دیسان ئایەتی ژمارە(٥) ئەوەی سەرەوی نەسخ کرد کە فەرمان بەکووشتنی کافران و مووشریکان دەکات .

## { ئایەتە مەنسوخەکانی سورەتی الأنفال }

تەنها یەک ئایەتمان هەیە والله اعلم کە ئەویش ئەچێتە باسی میراتە وە یان میراتە کە ئایەتی ژمارە(٧٢)وە لە بەشێکیدا ئەویش :

إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ [ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا ] وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ

الانفال(٧٢)

تەنها ئەوەندەی ناوکەوانەکە مەنسووخە والله اعلم ، چونکە لەوێدا الله تعالى باسی مووسڵمانانی مەدینە دەکات لە موهاجرین و انصار یش واتە ئەوانەی خەڵکی مەدینەبوون و مووسڵمان بوون پێیان دەووترێ انصار واتە پشتیوانەکان وەئەوانەشی خەڵکی مەککە بوون و کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە لە مووسڵمانان پێیان دەوترێ موهاجیر واتە کۆچەرەکان جا بۆیە لێرە دا الله تعالى ئەم موهاجیرو انصارانەی کرد بەبراو لە میراتی یەکتریش بەشداربوون واتە ئەگەر یەکێکیان بمردایە براکەی کە برای دینی بوو واتە هی دایک و باوکی نا ، بەشدار دەبوو لە میرات لەگەڵی لەهەمان کاتدا ئەو مووسڵمانەی کە لەمەکە جێمابوو هیجرەتی نەکردبوو بۆ مەدینە میراتی لە براکەی وەرنەئەگرت ئەگەرچی مووسڵمانیش بوایە تا هیجرەتیان کرد .

بەڵام ئەو حوکمە مەنسووخ بۆوە والله اعلم بە ئایەتی ژمارە(٧٥) ی هەمان سورەت واتە الانفال :

وَالَّذِينَ آمَنُوا مِن بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَٰئِكَ مِنكُمْ ۚ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ الانفال(٧٥)

واتا چی؟

واتە ئەو مووسڵمانانەی کە لەمەککە جێمابوون وهیجرەتیان نەکردبوو پاش ئەوەی هیجرەتیان کرد وە لەڕەحمیشەوە واتە لە دایک و باوکیشەوە بران ئەوان ئەولاترن بەبراتان لە کتابی اللهعزوجل .

## { ئایەتە مەنسوخەکانی سورەتی المجادلة }

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ { فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ۚ } ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ** مجادلة (١٢)

تەنها ئەوەندەی ناوکەوانەکە کە مەنسووخە والله اعلم چونکە پێش ئەوەی چپە یان قسەی نهێنی لەگەڵ پێغەمبەر(صلی اللهعلیهوسلم) بکرایە لەلایەن هاوەڵێکەوە دەبوایە خێرێکی بکردایە ، بەڵام نەسخ بۆیەوە بەم ئایەتەی خوارەوە واتە سەدەقەکە نەما :{ أَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ ۚ} (١٣) ئایا ترسان لە هەژاری کە صەدەقەکان پێشکەش بکەن لە پێش چپە کردنەکەتان؟ واتە: مەترسن ، اللهتعالی خاوەنی هەموو شتێکە، ئێوە کاری خۆتان بکەن و الله تعالی دەوڵەمەندە { فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ } ئینجا کە واشتان نەکرد واتە: صەدەقەیەکیان پێش نەخست ، الله تعالی ش تەوبەی لێ وەرگرتن { فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ } ئەوسا ئیتر نوێژەکانتان بە چاکی بە جێ بێنن و زەکاتیش بدەن { وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ } و گوێڕایەڵی الله تعالی و پەیامبەرەکەی بکەن { وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ } الله تعالی ش زۆر بە ئاگایە بەوەی ئێوە دەیکەن.

ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن : لەبەر دلۆڤانیی و میهرەبانی الله عزوجل بەرامبەر بە بەندەکانی خۆی، ئەو خێرو صەدەقەیەی بۆ سووککردن. (ئیبن عەبباس) دەڵێ: ئەو فەرمان بە سەدەقەیە تەنها رۆژێک بوو، پاشان الله عزوجل میهرەبانی باراندو لەسەر موسڵمانانی سووککردو سڕییەوە .

## { ئایەتە مەنسوخەکانی سورەتی الذاريات }

تەنها یەک ئایەت کە ئەویش :{ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَا أَنتَ بِمَلُومٍ } الذاريات (٥٤)

کە لێرەدا فەرمان بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرێت لەلایەن اللهتعالی کە ڕوو لە کافران وەرگێڕێ و ئەوەندە بایەخیان بۆ دانەنێت و گوێیان پێنەدات بەڵام هەر ئایەتی دوای خۆی نەسخی دەکات و دەفەرموێت :

{ وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ } (٥٥) تۆ بەردەوام ئامۆژگاری بکە، چونکە ئامۆژگاری هەمیشە کەڵک بە بڕواداران دەگەیەنێ ئەگەرچی ئەوانەش سوودی لێومرنەگرن .

وەهەندێ زانای ئەم زانستە دەڵێن ئایەتەکانی قیتال لە سورەتی التوبە نەسخی دەکات والله اعلم .

## { ئایەتە مەنسوخەکانی سورەتی المزمل }

کە لەناو زانایان وا مەشهورە دەڵێن سورەتێک هەیە کۆتایەکەی سەرەتاکەی نەسخ دەکاتەوە کە ئەویش ئەم سورەتەیە سەیرەیە ڕەحمەتی الله تعالی ت لێبێ لە سەرەتای هاتنی ئیسلام شەونوێژ فەرز بووە لە سەر مووسڵمانان وەکو لەم چەند ئایەتەدا دەفەرموێ :

{٢ / قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا } شەو هەستە واز لە خۆپێچانەوە بێنەو بێنەو گوڕ بە خۆت بدەو نوێژ بکە ، مەگەر کەمەکێکی شەو نەبێ بۆ خەوو حەوانەوەت .

{٣/ نِّصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا } ئەویش بەم شێوەیە: نیوەی (شەو) یا هەندێکی لێ کەم بکەوە (ئەگەر شەوگار درێژ بوو) واتە: شەو نوێژەکەت هەموو کاتەکانی شەوگاری پێ مەگرەوە ، چونکە ماندوو دەبیت ، بەڵکو سێیەک باشە .

{٤/ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ} یان زیاتری بکە ، ئەگەر شەوگار کورت بوو واتە: بیکە بە سێ بەشەوە ، دوو بەشی هەڵسەو، لەوە زیاتر نەبێ نە وەک بەهۆی ئەوەوە نەتوانی ئیش و کاری پەیامبەریەتی ببەی بەڕێوە .

{ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا } زۆریش بە ئاستەو لەسەر خۆیی و ڕێکوپێک ئەم قورئانە بخوێنەو دەوری بکەوە، با لە دڵتا جێگەی خۆی بکاتەوە .

(ئیبن عەباس) دەڵێت: ئەم بڕیاری شەو نوێژە لەسەر شانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)تەنها ساڵێکی خایاندو بە کۆتایی سوورەتەکە بڕایەوە ، ئەوەیە کە زانایان دەڵێن: کۆتایی سوورەتێک لە قورئان، سەرەتاییەکەی سڕییەوە.

بەڵێ بەڵام ئایەتی کۆتای دابەزی ئەمەی لە فەرزەوە گۆڕی بۆ سوونەت واتە دەتوانی بیکەی بەڵام فەرز نییە بەڵام لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) بەفەرز مایەوە وەکو دایکە عائیشەمان دەگێڕێتەوە :

کە پێغەمبەرمان (صلی الله علیەوسلم) هەردەیکرد واتە فەرزەکە لەسەر مووسڵمانان لاچوو والله اعلم .

ئەمیش ئایەتی کۆتای شەو نوێژ بە فەرزیی هەڵگیرا:

{٢٠/ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ} بێگومان پەروەردگارت چاک دەزانێ کە تۆ ئەی پێغەمبەر! (صلی الله علیه وسلم) نزیکەی دوو بەشی شەو، یان نیوەی، یان بەشی سێیەمی شەو هەڵدەسیت .

{ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ ۚ } هەروەها هەندێ لەوانەی کە لە گەڵتان هەڵدەستن بۆ شەو نوێژ ئەو دەمەی کە (فەرز) کرایە سەرت { وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۚ } الله تعالی ش ئەندازەگیری شەوو رۆژی کردووەو دەزانێ چوار وەرز چۆن بێ، کاتێ کورتە کاتێ درێژە، چونکە مەردم یان زوو هەڵ ئەسێ و، زۆر ماندوو ئەبێ، یا درەنگ هەڵ ئەسێ و کاتەکەی لە کیس دەچێ {عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ } چاک دەزانێ کە ئێوە قەت ناتوانن ئەندازەی ئەو شەوە ڕاگرن و بیژمێرن و لە کاتی خۆیدا هەڵسن بۆ شەو نوێژەکەتان { فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ }جا لەبەر ئەوە ئێوەی بەخشیی و باری گرانی لەسەر سووککردن، ئەوانەتان کە نەیان توانی بەو بەرنامەیە کار بکەن، وە یا قورئان بخوێنێ، بۆیە دەفەرمووێ: {فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ ۚ } جا چەندەتان بۆ لواو مەیسەر بوو بێ دیاریکردنی کات ئەوەندە شەو نوێژ بکەن، نەک ئەو سێ یەک و نیوەو دوو بەشی شەوە، چونکە جگە لەو هۆیانەش:

{عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ}الله ی میهرەبان زانی له ئاییندەدا كه كەسێكتان لێ نەخۆش بكەوێ و نەتوانێ هەڵسێ به شەو نوێژ { وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ} وه كەسانی تریش دەبن كه لەزەویدا دەگەڕێن بۆ بەدەست هێنانی بازرگانیی و فەزڵی الله عزوجل بۆ رزق و رۆزی بچنه سەفەر بۆ ئەم وڵات و ئەو وڵات {وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ} وه كەسانی تر له ئاییندەدا جەنگ بكەن له ڕێی الله تعالى (بچن بۆ جیهادو ماندوو ببن) {فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ} جا كەوابوو هەرچەندتان بۆ لوا ئەوەنده قورئان بخوێنن و شەو نوێژ بكەن، چونكه الله تعالى سۆزو میهرەبانی زۆره لەگەڵ بەندەكانی خۆیدا، وه دیاره مەبەستێكی تایبەتی خۆی هەیه له دانانی هەر جۆره الله پەرستییەكدا، لێرەشدا هەر له سەرەتاوه ویستی ئەو خەڵكه ڕابێنێ لەسەر شەو نخوونیی و ئاگاداریی و هۆشیاریی، جا كه مەبەستەكەی جێبەجێ بوو بۆیان دەگۆڕێ.

بەڵێ ئەوەی نووسیمان له ئایەته مەنسووخەكان تەواو بوو ئەوەندەی كه مەنسووخن و له هەردوو سەرچاوەی تابعینی بەڕێز [ابن شهاب ازهری و قتاده ] موه وه ئەوانیش له هاوەڵه بەڕێزەكانه وه به ئامانەت نەقڵم كردووه .

ئەوەی ماوەتەوه و نەمان نووسیووه وەك كتێبەكانی تر تەنها ئایەته [تخصیص] ەكانه و ئەوانەش وه ئالاتی یان ئەداتی استثناء دەچێته سەری كه ووتمان له كۆتاییدا ڕوونی دەكەینەوه ئێستا لێرەدا ڕوونی دەكەینەوه به چەند نموونەیەكی قورئانی چونكه ئەمانه پێیان ناوترێ مەنسووخ به لام پێویسته فێرخوازی ئەم زانسته لەگەڵ شارەزابوونی ئایەته ناسخ و مەنسووخەكان شارەزای ئەمانەش بێت .

## یەکەم / التخصیص

[التخصیص] تایبەت یان تایبەتمەندێتی یان لە نەحودا بەمانای توضیح یش هاتووە واتە ڕوونکردنەوە ، بە کوردیەکەی ی پێوویستی بەڕوونکردنەوە هەیە ئەو بابەتانە یان ئەو ئایەتانە کە [ دەچێتە سەر ڕستە یان دەربڕینێکی خەبەری واتە هەواڵێک بدات بەدەستەوە وە لە هەمان کاتدا ئەگەرێکی تیایە ئەو هەواڵە کە ئەگەرەکە جێ بەجێ بوو

ئینجا هەواڵە خەبەرێکە لائەچێت یان بەرزەبێتەوە یان نامێنێ لەسەر ی ئەو کەسە ئەمەیە پێی دەووترێ تایبەت ]

بۆنموونە :{ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ } التوبە (١٢٢)

سەیری ئەم ئایەتە بکە دەفەرموێ چی؟

دەفەرموێ : بۆ هەموو مووسڵمانان نییە هەموویان دەرچن بەیکجار بۆ جیهاد بەڵام ئەگەر یان وا چاکترە کە لە هەموو گرووپێک نەفەرێکیان بمایەتەوە بۆ فێربوونی عیلمی شەرعی واتە فقە بۆ تێگەیشتنی دین بۆ ئەوەی ئەوانەی دوای خۆیان تێگەیەنن.

ئینجا لێ ووردبەوە لە تەرجوومەکەی کە دەفەرموێ ئەگەر لە هەر گرووپێک[ یەک نەفەر یان چەند نەفەرێک] بچن بۆ فێربوونی علیمی شەرعی نەک [گشتتان ] بەڵکوو ئەوەی تری بابڕوا بۆ جیهاد ، لێرەدا چیمان بەدی کرد ؟

جیاکردنەوەی نەفەرێک یان چەند نەفەرێک بۆ کارێکی تایبەت واتا ئەوانی تر ناگرێتەوە تەنها کەمێک یان نەفەرێک دەگرێتەوە و [تایبەتە] .

ئەمە[ خاص] بوو یان[ تخصیص ].

بەڵام : هەندێک زانا چییان کردووە ؟ ووتوویانە ئەم ئایەتە ناسخە ، بۆچی ناسخە ؟ ئەڵێن چووەتە سەر ئایەتی ژمارە ٤١ ی سورەتی تەوبە مەنسووخی کردۆتەوە کەواش نییە سەیریکەن ئایەتەکە کە گوایە مەنسووخە :

{ انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ } التوبە ٤١

واتە : دەربچن گەورەو گچکەتان یان پیرو جەوانتان جیهاد بکەن لە پێناو الله عزوجل بە ماڵ و سامانتان دەڵێن چی ؟ دەڵێن [ انفروا ] لێرەدا ئەمرە و لە ئایەتەکەی تریش کەلە سەرەتاوە ئامەژەمان پێی کرد

کە دەفەرمێ [وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً ۚ] لێرەشدا ئەمرە مادام لەدوای خۆیەوە هاتووە مەنسووخی دەکات ، بەڵام وانییە مەنسووخی ناکات چونکە سەیری ڕوون کردنەوەکەی سەرەوەکەن بۆ ئایەتەکە کە تایبەتی کرد بە چەند کەسێک یان کەسێک واتە مەنسووخ نابێت

کە ئەمەش [ابو جعفر النحاس ] لە کتێبەکەیدا زۆر جوان ئەم بابەتانە ڕوون دەکاتەوە و زۆر زانایەکی ووردە لە م بابەتەدا والله اعلم .

جابۆیە فێرخوازی کورد دەبێ وریابی لە خوێندنەوەی سەربەخۆی کتابی ئەم زانستی ناسخ و مەنسووخە بەبێ فێربوونی ئەم بابەتانە چونکە بە بێ شارەزابوون و فتوادان بەفلان ئایەت مەنسووخە یان شتی تر لەسەرت گران دەوەستێ لە قیامەت الله تعالی بمان پارێزێ لە سزای خۆی امین .

وە زۆر ئایەتی تر کە باس نەکراوە ئایەتی ئاوان بۆیە لە بەشی مەنسووخەکەدا باسم نەکروون چەند ئایەتی تر هەیە تایبەتمەندێتی تیایە و ناتوانی بڵێ ی مەنسووخە بۆ نموونە هەندێ ئایەت کە تابع کراون بە میرات کە ئایەتی میرات ڕوونەو ئاشکرایەو دیارە بەکێ و کێ دەشێت بەڵام ناکرێ تۆ بێی ئەو ئایەتانەی کە باسی خێرکردن بە هەتیوان و خزمان مەنسووخ کەی بڵێی مادام ئایەتی میرات دابەزیووە ئەوانە

مەنسووخن نەخێر ئەوانە بەم شێوەیە ڕوونکردنەوەی تیایەو تایبەت و دەبێ ڕوون بکرێتەوە .

یان بۆ نموونە ئەو ئایەتانەی لەسەر مانگە حەرام کراوەکانە گشتی ڕوون کردنەوەی تیایە شەڕکردن تیایانداو وە نەکردن تیایاندا بۆ نموونە لە جێگایەک الله تعالی باسی مانگە حەرام کراوەکان دەکات کە [ رجب وذو القعدة وذو الحجة والمحرم ] ە کە ئامانە شەڕکردن تێیاندا حەرامە وەتاوانیش قورسترە تیایاندا لەچاو مانگەکانی تر بەڵام دەبینین لە ئایەتێکی تر اللەتعالی دەفەرمووێ چی ؟

{ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ } البقرة ( ٢١٧)

لێردا باسی مانگە حەرامەکانی کرد بەڵێ وایە شەڕکردن و کووشتار تێیدا حەرامە بەڵام ئەوەش بزانن کە فیتنە لە قەتڵ گەورەترە کەلێرە دا مەبەست لە فیتنە ( کوفرو ڕێپێدانی و بڵاوکردنەوەی و ڕێگری کردن لە مووسڵمانان و بۆگەیاندنی دین و دەرکردنی مووسڵمانان ) لەوە گەورەترە واتە لە و کووشتاری مانگە حەرامانە گەورەترە ئەو شتانە

مەبەست لێرەدا چی بوو؟

ئەوەبوو پێغەمبەرصلی الله علیەوسلم سریەیەکی نارد بە سەرکردایەتی عبدالله ابن جحش بۆ سەر کافران و دانەیەکیان لێ کووشتن و دوانیان بەدیلی هێنا لەگەڵ کاروانەکەیان بەڵام لە مانگی حەرامدا بوو ئەم شەڕە بۆیە قوڕەیش ووتیان محمد صلی الله علیە وسلم لە مانگە حەرامەکاندا شەڕی کردووە لەگەڵمان جا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم سەرەتا وەستا و خەم دایگرت تا ئەم ئایەتەی کە باسمان کرد لە سەرەوە دابەزی و دیلەکان وکاروانەکەشی وەرگرت و دیلەکانیشی بە بارمتە بەردا ، واتە ئەگەر ئاوابوو بۆتان هەیە شەڕیکەن بەوشێوەیە ی کە ئەوان دەسپێشخەربوون و وەکو دەزانن پێغەمبەر و هاوەڵەکانی چییان پێ نەکرا

ڕێگریان لێ دەكرا له بڵاو بوونەوەی دین پاشان دەركران پاشان ڕێگریان لێ كرا كه بچنه مزگەوتی حەرام

بەڵام دیسان له دوای ئەمەش له سورەتی التوبه ئایەتێكی تر دادەبەزێت باسی مانگه حەرام كراوەكانه كه شەڕ تێیدا حەرامه سەیریكه :

{ إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ ۚ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ }التوبه (٣٦)

كەلێرەدا دیسان جەخت له سەر ئەومانگانه دەكات و كه دەفەرموێ زوڵم لەخۆتان مەكەن تێیدا بەڵام هەر لەدوای ئەوەش دەفەرموێ چی؟كه هەرولەو ئایەتەدا ؟

دەفەرموێ كافران بكوژن هەموویان هەروەكوو چۆن ئەوان هەمووتان دەكوژن دیت؟

واته :[ئەگەر ئەوان دەسپێشخەربوون واته تۆ بۆت نییه بڵێ ی تەواو مانگه حەرامەكان مەنسووخ بۆیەوه بەڵكو تایبەت مەندی هەیەو ئاوا ڕوون كردنەوەی دەوێ].

یان له شوێنێكی تر ڕێ به كووشتنی كافران دەدات تەنانەت لەناو مسجد الحرامیش واته له له مەككەی پیرۆز دابێت بەڵام ئەگەر ئەوان واته كافران دەسپێشخەربوون وەكو دەفەرموێ كه له البقره دا له ئایەتی (١١٩)دا دەفەرموێت :

{ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ } (١٩١)

زۆر ڕوون و جوانه ،واته شەڕیان لەگەل مەكەن لای ماڵی الله عزوجل هەتا شەڕتان لەگەڵ دەكەن ئەگەر كردیان ئێوەش بیكەن ئەوەش جەزای كافرانه .

ئائەمه ڕوونكردنەوەو تایبەتمەندێتی یه [التخصیص] كه بەهیچ شێوەیەك مەیەڵه ئەم بابەته بەسەرتا تێپەڕێ و زیاتر خۆت شارەزاكه چونكه زۆر گرنگه والله اعلم.

## دووەم/ استثناء

ئە میش بەهەمان شێوە پێویستە فێرخوازی ئەم زانستی ناسخ و مەنسووخە پێوویسە بیزانێت کە چەندین ئایەتمان هەیە ئەداتی استثناء ی تیایە و دەبێ بزانی چۆنە و چۆن ڕوون دەکرێتەوە وە بە هەمان شێوە ئەو ئایەتانەی بە [ استثناء ] حیسابن مەنسووخ نین کە بەداخەوە دیسان لە کتێبەکانی ناسخ و مەنسووخ بەو جۆرە ئایەتانەش ووتراوە مەنسووخ کە مەنسووخیش نین جا لێرەدا بەکورتی باسی دەکەم تا شارەزاییەک پەیدابکەی و کەخۆت چوویتە خزمەت قورئان نموونەی زۆرتر دەبینی وەکو سورەتی (النساء) دوو ئایەتمان هەیە بەدوای یەکدا هاتوون :

{ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ} (١٤٥) النساء ، دیارەکە دووڕووەکان لەچینی هەرە خواری ئاگری دۆزەخدان {وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا } و تۆش هەرگیز ناتوانیت یارمەتیدەرێکیان بۆ پەیداکەی بەڵام هەر ئایەتێک دوای خۆی دەفەرموێ چی ؟؟

{ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا } (١٤٦) النساء ، مەگەر ئەوانەی تەوبە بکەن و خۆ ساز بدەنەوە { وَاعْتَصَمُوا بِاللَّهِ } و بەباشی دەست بەقاپی الله تعالى وە بگرن { وَأَخْلَصُوا دِينَهُمْ لِلَّهِ } وله باتی رووپامایی کردن بە پاکی و یەکلایی دینداری بۆ اللەتعالى بکەن { فَأُولَئِكَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ ۖ } ئەوسا لەبەهەشتدا لەگەڵ باوەرداراندا ئەبن { وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا } دیارە لە دوارۆژیشدا الله تعالى پاداشێکی زۆر مەزن بە ئیمانداراەکان دەدات ، لێرەدا چیت بەدی کرد ؟

سەیری ئایەتی یەکەم چی وەعدو وەعیدێک بوو دژ بە مونافیقان پاشان ئایەتی دووەم چی فەرموو لەسەرەتاوە ؟

فەرمووی[ ئیلا ]ئەوانەنەبێت کە تەوبە دەکەن و کاری چاک دەکەن ئەمە پێی دەووترێت چی ؟

یەکەم جوملەی پێش[ ادات استثناء] کە [الا] بوو پێی دەووترێت [مستثنى منه] وە [الا ] پێی دەووترێت[ ادات استثناء ] ، دووەم جوملەی دوای[ الا] پێی دەووترێت [ مستثنى ] ، واتە ئایەتەکە بەو [الا] وە بەستراوە و تەنها تایبەتە بە کەسێک کە جوملە مستثنى کە جێ بەجێ بکات واتە تەوبە بکات و کاری چاک بکات تەوبە لەچی لەو کارەی کە لە جوملە [مستثنى منه] کە دا هاتووە کەچی بوو ؟ کە منافقی بوو .

بەڵێ ئەمەش نموونەیەک لە م جۆرە ئایەتانەی کە ئاداتی استثناء دەچێتە نێوانیان و پێی ناوترێت مەنسووخ بەڵام دیسان بەشێکە لەم زانستە و بەو شێوەیە تایبەت دەکرێت ، بەڵام بەئایەتەکان ( نەئەوترێ مەنسووخ نە ناسخیشن ) ، جابۆیە ئەداتەکانی استثناء بناسە کە ئەمانەن

[إلا، غير، سوى، خلا، عدا، حاشا.]

## له کۆتاییدا

بەڵێ گەیشتینە کۆتای ئەم کتێبە وە سوپاس و ستایش بۆ الله جل جلاله کە یارو یاوەرمان بو بۆ تەواوکردنی کتێبەکە ، بە ئیزنی الله تعالی وە دواکارین لە الله عزوجل لێمانی وەرگرتبێ و بەخزمەتکارێکی ئەم قورئانە شەریفە قەبووڵی کردبین .

وە پێشکەشە بە هەموو فێرخوازێکی زانستی شەرعی کە دەیەوێت فێربێت جابۆیە هەرمووسڵمانێک ئەم کتێبەی خوێندەووە با لەبیری نەچێت دوعای خێر بۆ ئەو بەندانەی الله تعالی بکات کە خەریکی دانانی ئەم کتێبە بوون کە الله تعالی بە ئیمانەوە بمانباتەوە لای خۆی امین چونکە دووعای مووسڵمان بۆ براموووسڵمانەکەی ان شاءالله گەڕانەوەی نی یە .

تێبینی : هەرکەسێک وویستی سەرەنج یان پەیامێکمان پێ بگەیەنێ لەسەر ئەم پەرتووکە یان هەڵەیەکمان پێ بڵێ دەسخۆشی لێ دەکەین با پەیوەندی بە م جیمێڵەی خوارەوە بکات :

kosratmsharef@gmail.com

وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ

**الأربعاء ٢١ شوال ١٤٤٢ هـ**

